# ئەبەدییەتی غەریبی

## هونەر کاکەی فەلاح

2008

**پێشکەشە بە:**
**سروەی خێزان و خۆشەویستم کە هەمیشە**
**هەوڵی داوە کە من هەست بە نامۆیی نەکەم.**


**ناوی کتێب : ئەبەدییەتی غەریبی**
**بابەت : شیعر**
**نووسەر : هونەر کاکەی فەلاح**
**چاپی یەکەم / سلێمانی /** 2008
**تیراژ :** 500 **دانە**
**تایپ و مۆنتاژ : ژێوار شەماڵ**
**چاپ : چاپخانەی کاکەی فەلاح**
**ژمارەی سپاردن : (** 1451 **)ی ساڵی** 2008


**پێشەکی:**

**شیعر یان نووسین زۆر جار دەبێتە هێمن کردنەوەی رووحی شاعیرەکە یان نووسەرەکە . هەندێ جاریش دەروون قەرەباڵەغتر ئەکات . هەندێ جاریش وەك لە من رووی دا ئەوەندەی تر غەریبیت ئەوروژێنێ . هەست کردن بە غەریبی گرانترین بارە لە سەر هەست و هۆشی مرۆڤ . غەریبیش نە بە جێگایە نە بە کات . بارێکە و زۆر جار تا مردن بە کۆڵتەوەیە وە هیوادارم کە ئێوەی خوێنەر هەرگیز ئەو هەستەتان نەبێ و نەیبینن .**

**ئەم شیعرانە م پێش چوار ساڵ نوسیوە وا ئێستا ئە یخەمە بەردەم ئێوەی بەڕێز و هیوادارم کە خوێنەری خۆی بدۆزێتەوە و بەدڵتان بێت.**

PDF 4 KURD

# ئەبەدییەتی غەریبی

ئەم غەریبییە بە من غەریبە
دەم ووروژێنێ.
بۆ دەستی تەنیایی ،
لە یەخەی بێزارم بەرنادا ؟
بۆ ناتوانێ .
یەخەی تۆمەتبار کراوم
بە رازی بوون بە تەنیایی,
دەست بەرداری بێ ؟
بالأی تەمەن لقی ووشکە،
لە ئاگردانی فەوتانی هەوارگەدا ،
نێڵ نێڵ ئەسووتێ.
کۆترە و تواناى هەلبژاردنى جێگای
پەروبالْ ئەکرێ ،
بەندۆلی مانەوە و
بەردەوامی ژیانی لە شوێنێکا ،
بەردەوام ئەبێ.
شەرمی چاوە و
لە خولگەی بووکی زەمەندا ،
ئەسوورێتەوە.
روومەتی رازی بوون ،
بە شەرمەوە ،
ئەم کاتەی بە سەرا ئەسە پێنێ.
غەریبی لە چاودایە و،
پێشبرکێ لەگەڵ
لافاوی ژیان و
شە پۆلی گریانا ئەکات.
غەریبی لە دڵدایە و
دالْدەی مەلی هەلأتوو
لە سەرمای زستان ، نادات.
غەریبیە و بە من غەریبە ،
بیری کلۆرم
پێوانەیە بۆی.
قژی ئالۆز و
دەستی لەرزۆکم نیشانەیە بۆی.
ئەی سووتەمەنی رزگار بوون لەم

چرکە ساتە ،
لەم بستە زەمینە ،
وەرە...........
وەرە ، تا غەریبیم
بتۆرێنم.
بەشکم ،
هەوری بێ ناسناوی ئەم جێگایە ،
برەوێتەوە.
بەشکم
کات ژمێری بەختیاری چەکەرە کا و
زەمەنی تازە بخاتەوە.
لەوانەیە ،
خۆلەمێشی کورەی بوژانەوە ،
کرنووشی نوزەی بەردەوامی بەرێ
بۆ ئەبەدییەتم.
لەوانەیە ،
خۆڵەمێشی کورەی بوژانەوە ،
توانای سوتانی
پەستی پێ مابێ.
لەوانەیە
خۆڵەمێشی کورەی بوژانەوە ،
توانای بە هەڵم بوونی
ئاوی قەتیس ماوی ،
کاتژمێرە وەستاوەکەمی مابێ.
ئەگەر ویستنمان بیەوێ ،
ئەتوانین ،
سوچێکی ئەم غەریبیە ،
بە تینی ئاشنا بوون،
لە سڕی گفتوگۆ ،
گەرم کەینەوە.
بە ئاشنا بوون
لە حیکایەتی بەر ئاگردان.
لە نووری بەخێرهاتن ،
لە داکەندنی پەستەکی پەستی
لە بەری یەکتر.
ئەی سووتەمەنی رزگار بوون ،
لەم زەمینە ئەزەلییە ،

لەم چرکە ساتە ئەبەدییە ،
لە روو دامەمێنە
وەرە.....................
وەرە
تا ئاشی زەمەنی وەستاوم
بکەوێتەوە گەڕ.
تا زەمینی تەنیاییم تولە ڕێی موحیبەت
لەتی کا.
تا غەرییبیم سەری خۆی هەڵگرێ.
سوید / شوباتی 2004

PDF 4 KURD

# جەهەنەمی ئەم دنیایە

بێ خواستی ئیلاهی ،
لە چرکە ساتێکا ،
لە زەمینێکا.
زما نحاڵی ووشە ،
مامەڵە لەگەڵ خواستی خۆیانا
ئەکەن.
ئەیانەوێ
کارەساتی بێزارییان
لەگەڵ خوێنما تێهەڵکێش کەن.
تامەزرۆن
چیرۆکی بێز کردنەوەیان
لە خودی خۆیان
بۆ من باس بکەن.
ئەگێڕنەوە و ئەڵێن:
کە پەژارە بە پەژارەیی دانیشتووە.
ئەبەدیەتی خەفەت
خەمبار بووە.
زەردەخەنە
پێکەنینی بە خۆی دێ.
فرمێسك
گۆنای تەڕی خۆی ئەسڕێ.
زام ،
برینی هەمیشەیی کولاوەتەوە.
سەر ، وای بە باش زانی ،
ملی بکات بە قەنارەوە.
گڕ بەتەمایە
خۆی بسووتێنێ.
ژیان لە ژینی خۆی بێزارە ،
زاهیدە و ئەیەوێ سەرهەڵگرێ.
شادی ناشادە.
مردن دەمێکە مردووە.
خەیاڵ خەیاڵی رۆیشتووە.
رەنگ دەموچاوی ژەنگ هەڵاتووی
رەش کردووە.

شین بۆخۆی
شین ئەگێڕێ.
سوور لە شەرمانا
سوور هەڵئەگەڕێ.
سەرما سەرمایەتی.
گەرما دڵی سووتاوە.
هەندێ مرۆڤـــ ،
شەرم لە مرۆڤایەتی خۆی ئەکا.
بەداخەوە ،
لە بەر هەیمەنەی فەوتێنەری
خواستی مرۆڤـ.
مەدلولی هەموو وشەیەك
هەموو شتێك ،
بوونی هەموو بونەوەرێ ،
هەر لە کاتی وەرگرتنی بڕوانامە
بۆ ئەم دنیایە.
ژینی یەکسەر ،
بە جەهەنەم دەست پێ ئەکات ،
جەهەنەمی ئەم دنیایە.
سوید / شوباتی 2004

PDF 4 KURD

## بیرکردنەوەی سەرۆکێ لە زەمین وئاسمان و ئەوەی لەو بەینەدایە

جەستەم ووجودی هەیە.
لە تەك موعجیزەی ئەفساناویدا
جێگام هەیە.
چەمکێکی ئەم زەمینەشم ،
بە ئێوەوە
خستۆتە ژێر رەحمەتی خۆم ،
عەدەمیەتم پێ بەخشیون.
ئاسمانەکەشی هێمایەکە
بۆ ئەبەدییەتم.
ئەشزانم
خواش پەشیمان بێتەوە
لە درووست کردنم ،
شەیتان میوانداریم ئەکات.
بەهەشتیش تامەزرۆی بینینمی
نەمێنێ.
گڕە جەهەنەم
بەفری دڵ گەرم ئەکاتەوە.
لایلایەی بەهاریش
لە رووحی موبارەکیشم بێزار بێ،
جۆلانەی مۆسیقای خەزان
ئەتوانێ بمخەوێنێ.
با ئەوان لە ئاسمان
جێ بێڵم.
بگەڕێمەوە لاتان و
تین و تەوژمی باوك سالاریم ،
بە سەرتانا تاقی کەمەوە.
سەردەمێکم بۆتان بنیاد ناوە ،
پەرەسێلکەی نابینایی تان
لە ئاسمانی تا پۆکراوما ،
بەرق باران ئەکەم.
نەوەکو باڵەکانی

کەروێشکە بە سەروەری ئاسمانیم بکات.
نامەوێ
ویستە ئاخوازە بێ باڵەکانتان ،
شوێن نمایشی گەرمەخەیاڵم
بشێوێنێ.
دڵتان بە چی خۆشە!
خۆ خواش تاقەتی ئێوەی نەماوە ،
بەجێی هێشتوون.
فریشتەکانیشی
سەرقاڵی کاری تری ئیلاهین.
شەیتانتان بۆ ماوەتەوە ،
ئەویش بە سواری حوشترێکەوە ،
بە ووشکە بیابانی
خەیاڵاوی هیواکانتانا
تێپەڕئەبێ.
دێت و خۆی لە زەردە گەڵا و
لقی بێ بەرتان دەئاڵێنێ.
درختەکانتان دەناڵێنێ.
وەك قەوزە ،
دەریا لیخنەکانتان ،
لیخنتر ئەکا .
خوێ ئەکا بە زامەکانتانا.
خۆی ئەکا بە زام.
ژەهر و گەڵا
بە یەکتر ئاشنا ئەکا.
پاسارێکان لە قەلەڕەش
مارە ئەکا.
قەنارە
بۆ رووباری بێ دەسەڵاتیتان
هەڵئەخا.
شایی بۆ کوێرەوەریتان
ئەگێڕێ.
هەڵپەرکێ یە و
مردن دەستی
کۆڵێرای دوودڵیتانی گرتووە.
چەقۆ دەستی
لنگە فرتێ ی راڕایی تانی گرتووە.

شەیتانیش گۆرانی
بە سەر ساویلکەییتانا هەڵئەیا.
منیش تە پڵ بە
مەردایەتیتان لێ ئەدەم.
خواش سەیر ئەکا.....................
سوید / شوباتی 2004

PDF 4 KURD

## ئاوڕدانەوە لە گۆڕستانیساڵەکانم

لە ساتێکا کە بێزار بووم
لەم ساڵە شەکەتەی تەمەن ،
تراویلکەی بیر کردنەوەم
بووە هۆی وەستانی زەمەن.
بۆ قەبرسانی جە نجاڵی
ساڵە گۆڕبە گۆڕەکانم.
هەنگاوی پەشیمانیم
جۆگەلەی ئاشنایەتی بەست.
ئاوی حەیاتە و تینوێتی شکانی
دڵی بیرەوەریانە.
وەکو ( مەسیح ) یان بینیبێ.
زیندوو بونەوە ،
ساڵەکانم زیندوو بونەوە.
وا دیارە لە گۆرستانیشا
مردووە ساڵ چیرۆکی زەمەنەکەیان ،
ساڵەکەیان ،
لە گوێ ئاگردان بۆ یەکتری ئەگێڕنەوە.
کە منیان بینی
بەرۆکیان گرتم ،
ویستیان
شەرعیەتی ئەم ساڵەشم لێ بسێننەوە.
بێ ساڵ بەجێم بێڵن.
بیریان چۆتەوە
بە چ قەدرێکەوە ،
ماچی ماڵ ئاوایم
لە گەردنی هیلاکیان ئالاندووە.
هەر خۆم ئەزانم
بە چ شکۆیەکەوە ،
کەژاوەی بەردەوامییانم
تەسلیمی ساڵێکی ترم کردووە.
مناڵ بوون و بیریان نایێ ،
کە بە چ شاگەشکەیی یەکەوە.
نۆمانگەی تازە ساڵم
بەخێرهاتن کردووە.

تا بە پڕبوونیان
بە مەئاساتی دونیایی.
من بلێم چی
کە کویرەوەری کوێری کردوون.
شەلەلی غەڵبەغەڵبی دونیایی ،
لە پایزی تەمەنیانا
لە پێی خستوون.
من فێرم کردن
کە زەمەنی ئەفلاتونیەت
بەسەر چووە.
من فێرم کردن ،
چۆن چەمۆڵە لە ژان و
چۆن ئافەرینی قاقای خۆیان بکەن.
گەورەم کردن و
ساڵم پێ پڕ کردنەوە.
جەژنی لە دایك بوون و
جەژنی ناشتنیانم پێکەوە گێڕا
فێرم کردن
کە عەبەسیەت نی یە ،
هەموو ساڵێك
من مناڵە ساڵێکم ئەبێ ،
هەموو ساڵێك
من پیرە ساڵێکم ئەمرێ.
سەیرە
ئەوان توانای ساڵێکیان نەگرت ،
من بە تۆپەڵە ساڵ
گوێلاکی زەمەنەکەم ئەشکێنم ،
هێشتا توانای
ساڵێکی تریشم پێ ماوە.
شیلەی توانام لە شەلالاتی نیاگراوە
ئیلهامی بەردەوامی
وەرگرتووە.
ئەم ساڵە کاتژمێر لە دەستانەم
فێرکرد.
کە گوێ بە شوێن بەن
نەك بە زەمەن.
لەززەت لە نەخشە وەرگرن

نەك لە كالێندەر.
ئێستەش لێم راست بوونەتەوە ،
خۆزگە ئەمزانی
چیان لێم ئەوێ.
خۆشم نازانم
چیم لێیان ئەوێ.
تەنها ئەزانم کە باش بوو
خۆم لە گۆرستانی رۆژەکانم
نەیا .
سوید / شوباتی 2004

PDF 4 KURD

# ئەوان و ئەمان

ئەوان
لە گریانا پێکەنین
بۆ هەنگ ئەدۆزنەوە.
زەردەزیرەش ،
وەك هەنگ سەیر ئەکەن.
بابۆڵەی گومان لێکراو
ناخۆن.
شەمەنەفەری تەنیایی
بە سکەی قبوڵکردنیانا ناڕوات.
شایی گوێچکەی نەشازی
ئەناسێنن بە مۆسیقا.
فرمێسك تەحنیت ئەکەن.
مۆمیا بۆ خەفەت
درووست ئەکەن.
وەفایی سەگ
لە جزدانەکەیاندا ئەوەڕێ.
بێ سیفەتی
بە سەر هەموو پشیلەیەکا
دانابڕن.
لای ئەوان ،
کەللە لە سەر ملە و
لەشیش لە ژێریایە.
هەموو شتێ لە جێی خۆی دا,
لە ئینجانەی عەقلایە.
مانگیش ،
پاسەکەی جەژنە و
ئەوان بە ناو کووچەی ئەستێرەکاندا
ئەگەڕێنێ.
دڵە گەرمە ،
لە خۆرەوە خۆراك وەرئەگرێ ،
تریفە قردێلە یەو ،
هەوری ئاوریشمیش
کراسی بوکێنیانە.
زامی ئەوان

یەخەی چاك بوونەوەی خۆی ئەدڕێ.
خەزانی فرمێسك
دڵۆپ دڵۆپ هەڵئەوەرێ.
شیرین و فەرهادیان
بە یەك ئەگەن.
ئەمان
گریانیان بە پێكەنین دێ.
هەنگاو لەگەڵ كیسەڵا
پێشبڕكێ ئەكا.
چارەنووسە و لە تەختی
ناوچەوان نووسراوە.
ڕۆژی نیوەڕۆ یە و
بۆ شەو بە بووكێ براوە.
دەستی بێزاری بەرئەدرێ بە قۆڵیانەوە.
كۆترە و هێلانەی قەقنەسی
پێ گەرم ئەكرێ.
خەو بەردە و
بە شووشەی هۆشیاری وە
خەو ئەبینێ.
زەمەن ژیلەمۆیە و
ئاگردانی مەستی
پێ جۆش ئەكرێ.
كە چاو كوێر بێ ،
شەیتان بە لەعنەت ئەكرێ.
دەم و شووكور پەیوەندیەكی
ئەبەدیان هەیە.
لای ئەمان تەنها ڕەش و سپی
وجودی هەیە.
پرووشەی بەفر لە چاوی زەمینەوە
بە سەر گۆنای ئاسمانا ئەبارێ.
دڵۆپی بارانیش بووكە و
كەژاوەی بۆ ئاسمان ئەبرێ.
ژیانە و ترش و خوێ ی
بە سەرا ئەكرێ.
پەژارە جۆلانەیە و
بۆ ئاسوودەیی دڵ
درووست ئەكرێ.

لای ئەمان
ترس پاڵەوانە و
ترس لە مەزهەبیا نی یە.
دوو دڵی تەنها لە ووجودی خۆی
دوودڵ نی یە.
خۆشەویستی سەرکەوتوو نەبووە و
نابێ.
شیرین و فەرهادیشیان
بۆ یەکتر نابێ.
سوید / ئابی/ 2004

PDF 4 KURD

# وەلاّم بۆ بەردەوام بوون

لە سەرژمێری
تۆف و رەهێڵەی ئابلۆقە دراو ،
نەبوومەتەوە.
بۆچی ئەتەوێ لە سەرەتاوە
دەست پێ کەمەوە ؟
ژیانم چیمەنی شیوەن
لە مەیدانی پەشیمانی سەوز ئەبێ.
هاواری پیرە دارە و
لە گەرووی مردنەوە
فوو ئەکا بە زەمەنی
فەنا بوونا.
سەرابی پەیوەندی رووحمە
لە دابڕان و
تازە گاگۆڵکێ ئەکا.
پێکەنینە و
سیمای عەدەمیەتی پێ بڕاوە.
گریانە و لە خشتە براوە.
سەرە نوێلکی بیر کردنەوە یە و ،
بێزوو ئەکا
بە فەنتازیای سفرەی دوارۆژەوە.
چاوم چاوەڕوانی کوشتویەتی ،
ئەم دنیایە تەم و ئێڵی
پێ بەخشیوە.
پێش ئەوەی تازەگەری
هارمۆنی بخاتە پرۆژەی بوو نمەوە.
وویستم تێگەیشتنم
گوێ لە وەلاّمی پرسیارێکی سوواو
بگرێ.
پرسیارێ کە لە تیشکی ئاوساوی ،
هاواری خۆم و
ئەوانەی لە دەنگمەوە هەمهاوارن ،
روناکی وەرگرێ.
پرسیارێ بتوانێ
سەددای وەلاّم وەرگرێتەوە.

پرسیارێ نهێنی ژیانی
ئێستا و داهاتووش، شی بکاتەوە.
پرسیارێ پاڵپێوەنەر بێ
بۆ ژیان.
توانای بەردەوامیم لە گیرفانی ئاسمانا
گەڕا بۆ وەلاّم ،
بە دەست بەتاڵی هاتەوە.
گێژە لۆکە لە بەردەمی قومارخانەی
قانونی ژینا
بە گێژی بەجێی هێشتین.
بە چرپە پێیان ووتین:
ئەم ژیانە قومارێکە ،
چیت هەیە لە سەری دانێ ،
یاخود وارەکە بۆ تۆیە ،
یا ئەوەتا سەرت دانێ.
سوید / شوباتی 2004

PDF 4 KURD

## پیس بوون

دەم و چاوی مارمێلکەیە و
مێژووی بچوك بونەوەی دایناسۆرو
پوکانەوەی مێژوومان
بۆ ئەگێڕێتەوە.
دەم و چاوی مرۆڤە و
لاسەنگی ئەم سرووشتە
ئەسەلمێنێ.
فڕتێکەوتنی هەموو بونەوەرێ ،
مۆتەکەی بەهارە و
لە سەر خەزانی بێ تاقەتی
سەوز ئەبێ.
پەژارەیی ئاگرە و
لە ئاوا لەقە فرتێیەتی.
ڕەنگاو ڕەنگی وەرزەکانە و
لە چاوی کوێرەوە سەیر ئەکرێ.
بەردە و
توانای سەر شکانی نامێنێ.
مۆسیقای زەوی قڵیشدارە ،
کە شینی مردنی دارستان و
نالەی ڕەگەکا نمان ،
دێنێتە گوێ.
ڕێژەی وشکانی و ئاوە و
شە پۆلی دەسەلاتی مرۆڤ ،
لە قوتا بخانەی ناعەدالەتیدا
فێر ئەکا.
هێمای فەوتێنەری دەسەلاتی مرۆڤە و
ئەنێررێ بۆ ئاسمان.
سڕ بوونی شیعرە و
پەژموردەیی مۆسیقا و
نەمانی هەستە ،
کە لە مۆزەخانەی کلاسیکیدا
هەڵگیراوە.
نالەی سرووشتە و
لە بەندیخانەی خۆیا بەند کراوە.

لەبەر مرۆڤــ خۆیەتی
کە هەموو شتێ پێشێل کراوە.
تەنانەت دوارۆژی خودی خۆی
پشت گوێ خراوە.
سوید / شوباتی 2004

PDF 4 KURD

# ژیانی پەچەدار

لە ولاٌتێکی نامۆدا
من غەریبیم لیٚ ئەباریٚ.
کە جۆگەلەی فرمێسکی پەرش و بلاٌوم
لە گلێنەی پەشیمانی نامۆ بوونیا
تنۆك تنۆك بۆ ووشك بوونی
خۆی ئەگری.
بەردەوام بوونی ژیانم
پێویستی بە توانەوەی
رووحی گیرۆدە و شێواوە.
ئەتوێتەوە و ئەباریٚ بە سەر کەناری
توورەبوونی تەنیاییدا.
بە سەر پەستی ئارەزوو دا.
بە سەر زەمینی بیٚ کەسیدا.
بە سەر خۆما.
بە هیوا یە ،
پەچەی سەر رووی
دنیای دەم و چاو ئاولاٌوی دایاتەوە.
بە تۆپەڵ لە دوای پەردەوە ،
قلٌیشانی هیواکان و
ناعەدالەتی دابەشبوونی رەنگەکان
بشارێتەوە.
گەر بکرایە ،
هەناسەی ژیانێکی تر ،
پەیوەست لەگەڵ بیٚ لایەنی بیرو بۆچونا ،
ببەستایە.
ژینیٚ دابڕابیٚ لە ژاوەژاو ،
لە دڵی زریزە دراو.
ژینیٚ گلێنەی پەشیمانی هیچ لێك نەنیٚ.
پێکەنینی لەبیر نەچوبێتەوە و
گریانیش بیٚ مانا نەبیٚ.
ئەستێرەی پرسیار لەو ژیانەدا
وەلاٌم لیٚ ی ڕانەکا.
دەرەنجامی بیٚ ئامانج و بیٚ ئە نجام نەبیٚ.
توێکلٌی خورافات پاك بکریٚ ،

پێویستی بە  پەچە نەبێ.
هەموو شتێ ،
پەژمووردەیی بەرائەت ،
ترسنۆکیی پاك ،
نایاسایی سکالاَ ،
هەڵەشەیی پێکەنین ،
بێ پیس بونیان بە ووشەی لکێنراو ،
بێ ئەوەی سەدەی خەڵۆزانە
دەم و چاویان رەش بکات.
ژیانێ کە حەوت پەراسووی
لە ژیانی تر زیاتر نەبێ.
ئەشکەوتی هیواکان
تاریك نەبێ.
ژیانێ بیانووی بۆ نەدۆزرێتەوە و
پیتاکی بۆ کۆنەکرێتەوە.
ژیانێ بەشی هەموو کەسێ بکات.
پێویست نەکات لیك ووشەکانی تەڕبکات.
راوکەری تیشکی رووناکی
ئاسمانی بیرچونەوەمان جێ بێڵێ.
هەورە برووسکە ی بالگرتوو
بگەڕێتەوە بۆ دڵی سارد و سڕ.
یاسای دارستان نەمێنێ.
سوید / شوباتی 2004

PDF 4 KURD

# پەتی بۆ بەرەڵاکەن

چیرۆکی بەفرە و
لە بەردەمی ئاگردانا ئەگێڕدرێتەوە.
سەردەمێکی تەزۆکە و
زەمەنی وولاتێکی سەرلێشێواوی
لیَ کەوتۆتەوە.
دارستانی ئەم دنیایەش
لە سەر ئەژنۆ دانیشتووە و
پێمان ئەڵێ : یارمەتی بەن!
پەتی بۆ بەرەڵاکەن!
با چارەنووسی غەرق بووی
راکێشێتە کەنار.
یان قەنارەی پیَ درووست کا و
بە داری زەبر و زەنگی ساڵەکانیا
فرمێسکەکانی هەڵواسیَ.
وازی لیَ بێنن وولاتەکەتان!
وولاتێکی عاشقە ،
با عەشقی خۆی بکاتە نامەیەك و
لە بەر تریفەی مانگە شەوا
بۆ ئەستێرە تازە دڵدارەکانی بخوێنێتەوە.
وازی لیَ بێنن ! دڵی گەرمە ،
با گەرمی دڵی لەگەڵ دڵی خۆرا
قسە بکات.
وازی لیَ بێنن زۆر تینووە ،
با خوناوی گەردنی هەورەکان
بخواتەوە و
تینوێتی بێدەنگ بکات.
با هیچ نەبیَ بۆ جارێکیش بیَ
لە سەر بەرماڵی ئاسوودەیی
نوێژ بکات.
لەگەڵ فەقێی ئاگردانا کۆبێتەوە و
سەرمای زستان لە دەرەوەی حوجرەکەیان
رەق کەنەوە.
پێی رەوا ببینن!
با بەهار لە هەناسەیەوە

گۆرانی بۆ نەورۆز بڵێ.
گوناح نی یە با کێلی پەشیمانی خۆی
هەڵبەستێتەوە.
گوناح نی یە ،
شۆڕش لەگەڵ رابردووی خۆیا
هەڵگیرسێنێ.
ژیانێکی سەختی بینیوە.
با کڵپە لە دەمیەوە
ووشەی بەستوو گەرم کاتەوە.
با ئاسمان میوان بێت و
مشتێ ڕووناکی بۆ بێنێ بە دیاری.
چیتان لێ ی ئەوێ ؟
خۆ دڵی ئەو دەمێکە
بە دڵی خۆی ناژی.
دەمیشی بگاتە بەرسیلەش
ناتوانێ بڵێ ترشە.
بۆ وازی لێ ناهێنن ؟؟
شایی یەو.
هەڵپەرکێی زامەکانی بەجۆشە.
دەهۆڵ و زوڕنای سکاڵای ،
گەیشتۆتە حەوت تەبەقەی ئاسمان.
لە ژێر خۆری ماتەمینیدا ،
ژیانی خۆی هەڵخستووە.
ساڵەکانی باڵیان گرتووە و
خۆیان بۆ ناگیرێتەوە.
ئاواتەکانی سەری خۆیان هەڵگرتووە و
لە غەریبیا سەر ئەنێنەوە.
لە وەرزەکان بێزارە و
وەرز نەماوە تیایا بژی ،
لەو بەینەدا ماوەتەوە.
وازی لێ بێنن !
وازی لێ بێنن!
با خۆی وەرزێ بۆ خۆی هەڵبژێرێ.
سوید / مارتی 2004

## پەیوەندیە

دنیا بەرامبەر بۆچونمان راکشاوە
جار هەیە بووکە و رەمزی روناکی یە.
لەگەڵ بارانی هیوایا
پرچی پەلکە زێرینەی تێکەڵ کراوە.
جاری واش هەیە
لاشەیەکی گیرۆدەیە
لەگەڵ تەرمی رووباری بێزاریماندا
نێژراوە.
بیرکردنەوەی ساتە وەختە و
خەتابارە
دەنا دنیا یەك دنیایە .
بەند کردنی خەندە و خەفەت
خەتابارە
دەنا ژیان یەك ژیانە .
کاتێ کە بە بوکی ئەبرێ
تاراکەی شینێکی کاڵە.
ئاسمانی ساف و
دەریای بێ سنوری دەمە و بەیانی
رەنگی ئەکەن.
کراسێکی خەیاڵاوی ،
هەورەکان بە پەڵە هەوری سپی و ناسك
مانگ بە تریفەی سحراوی
بۆ بوکێ ی ئەبەن بە دیاری.
مۆسیقای شایی
هارمۆنی سیمفۆنیایەکی تێکەڵە
لە هاژەی ئاو ،
سروەی بەیان.
جریوەی ئەستێرەی شەوان.
سۆفی شعر
بە هێشووە ووشە
بەرۆکی بووکێمان ئەهۆنێتەوە.
خەندەش وەکو
چوکلێت بە سەر هەموو شتێکا
هەموو ووشەیەکا

PDF 4 KURD

هەموو بیر کردنەوە و هەڵسووکەوتێکا
دا بەش ئەکرێ.
کاتیێکیش کە وا لاشەیە ،
ئاسمانیش بەرق و باران
پیێشکەشی چاوی گریاناوی شیوەن ئەکا.
تابووتی ووشکی گوڵە گەنم
لە سەر شانی تۆفان
بۆ گۆرستانی سارد و بێ ئاو
بەرێ ئەکەوێ.
کۆچی هەتاوە و
بۆ گۆرستانی تاریکی بەرێ ئەکەوێ.
کۆچی ئاسکە و لە دەمی دڕندەیەکا
دوا ساتی خۆی ئەبینێتەوە.
دڵۆپی گریان لە جیاتی ئاوی گوڵ
بە سەر هەموو شتێکا ئە پرژێنرێ.
بیر کردنەوەی ساتە وەختە و خەتا بارە
دەنا دنیا یەك دنیایە.
رزگار کردنی خەندە و خەفەت خەتا بارە.
دەنا ژیان یەك ژیانە .
سوید/ تشرینی دووەم / 2004

PDF 4 KURD

# تراویلکەی مێژوو

تراویلکەی ئەم ژیانەم
هەوڵئەدا ببێ بە راستی.
وەك دەریایەك یان چیمەنێك ،
ببینرێت و
لە تراویلکەیی دەربچێت.
ئەیانەوێ دەریا لە رووبارێکا
جێ کەنەوە.
دەست و قاچی نیشتمانێك ببڕن و ،
وولاتێکمان بەنێ بە گۆچانێکەوە.
ئەیانەوێ مێژوو
مناڵێکی ببێ لە خۆی بچێ.
وەکو سێوێ کرابێ بە دوولەتەوە.
ئەیانەوێ
گەردوون لە سەر گابەردی
ئەستێرەکانی خۆی ،
خل کەنەوە.
بە ناو خەتی کاکێشاندا بە پرچی پەلکەزێڕینەی ،
رایبکێشن.
بە بارانی گریانی خۆی بیشۆن و
لە دەریاکانیا نوقمی بکەن.
ئەیانەوێ تراویلکەی ئەم ژیانە
بکەن بە راستی.
وەکو دەریایەك یان چیمەنێك ببینرێ.
لە تراویلکەیی دەربچێت.
ئەیانەوێ.
لێوی ئاو ووشك بکەن.
لێوی خۆزگەکانمان ،
شینی ناشتنی خۆیان بگێڕن.

سوید / ئابی/2004

## ژیان لەگەل نامۆیی دا

وەرەو دەستی نامۆییم بگرە
با هەستی ژیانەکەم
لە قوڵتەوە
سەردانێکی تێگەیشتنت بکات.
وەرە
با هەستم پشوو بات
لە نامۆ بوونم.
وەرە
با چاوەکانم
تەماشای بینینت بکەن.
با چرچی ناوچەوان نەمێنێ و
بگوێزرێتەوە
بۆ ژێر چاوان.
وەرە
من ئەمەوێ شیلەی دەمی
هەموو هەنگەکان بەمەوە بە دەمی گوڵ.
ئەو هەنگوینەی لەم باخچەیەدا
دەست ئەکەوێ
بە دەمی من تاڵە.
من نەشازم بەم باخچەیە.
گەلاکان
تەماشاگەری خۆیان هەیە.
ئاوی خۆیان
هەوری خۆیان
پایزی خۆیان و بەهاری خۆشیان.
کە سەیری گەلا ئەکەم
پەژارەیی خۆی تێکەڵی بینینم ئەکات.
گوێچکەم سیمفۆنیای شیوەن
تێکەڵ بە بیستنم ئەکات.
بۆ دەنگی بولبولی ئەم باخچەیە ،
شیر لە گوانی حەقیقەت بدۆشە.
راستی کەوڵ کە و پێستی لەبەر داکەنە ،
خۆت هەڵمەخەڵەتێنە.
ئەو دەنگە هەمیشە لە سەرما گڤەی دێ.

**وەرە فێری کە**
**چۆن ببیٚ بە سروەیەکی هێمن ،**
**بە سروەیەکی فێنك.**
**وەرە فێرم کە**
**چۆن لەگەلْ نامۆیی دا**
**بژیم.**
**سوید** / **ئابی** / 2004



PDF 4 KURD

## لافاوی غەریبی

گۆرستانی ووشەیە و
لافاوی غەریبی رای ئەماڵێ.
بۆیە ئەبینی هەرچی ئەڵێم ،
هەر ووشەیەك
کێلێکی بە شانەوەیە و لە ئاو رائەکا ،
لە ئاو ئەترسێ.
ئەڕوا تا لە غەریبی یەکی ترا ،
گۆری خۆی دائەگرێ.
پا پۆری هەست و نەستە و
توانای شە پۆلی تەنیایی ناگرێ.
بۆیە هەر هەستە و بە خنکاوی سەر ئاو کەوتووە.
نەستیش خەیاڵی لای دوا قوومە هەناسەیەتی.
پێش ئەوەی ببێ بە ماسی و
ئاو بکا بە هەوا.
پێش ئەوەی سرك بێت و
لە دەستی غەریبی دا بخلیسکێ.
لە دەیایەکی نامۆیی تردا
خۆی ببینێتەوە ،
خۆم ببینمەوە.
هەمووی هەر ترسە لە هەوا ،
لە ئاو ،
لە دەریا.
ترسە لە گۆڕستانی غەریبی ،
لە نامۆ بوون ،
لە زەمەن و لە عەرزی خوا.
هەمووی هەر عەرزی خوایە ،
بەلاّم عەرزی من نی یە.
زەمەن زەمەنی خوایە ،
بەلاّم کات کاتی من نی یە.
چەکەرەی چیرۆکی پەشیمانی یە و
لە دلاّ بووە بە پیرە دار.
رەگەکانی لەگەڵ موولولەی خوێنا
دەست لە ناو دەست خوێن ئەمژن.
کلاّوی بێزاری یە و

هەرگیز با نایبا.
ڕەگەکان لە ناو سەرا ڕۆچون و
مێشك ئەمژن.
زەمەن پەلەقاژێیەتی
ساتە وەختەکانی
بە پەیژەی فەوتانا
بۆ چاڵی بیر چوونەوەی ئەبەدی
شۆڕ ئەکرێنەوە.
وەکو میلی کات ژمێرەکەی
لە قوڕی خەستی ڕەق بووی
ئەم جیٚ یە خورافیەدا چەقی بێت.
چاوەڕیٚ ی لافاوی غەریبی یە
ڕای بماڵێت.
سوید / ئابی /2004

PDF 4 KURD

## تێپەرین

ئەو کاتەی ساتی نەفرەت لێکراو ،
لام ئەوەستیٚ!
لە بەینی خەوو خەیالاّ ،
ژین و مەرگا ،
خۆم ئەبینم.
بە دوای مانا و
جەوهەری ژینا
را ئەکەم.
وەك گروگاڵی مناڵیم
لیٚ ون بوبیٚ.
بە دوای لۆژیکی مردنا ،
رووحم
بە ئاسوودەیی هەنگاو ئەنیٚ.
نامەویٚ مردنی بێگوناح
چاو لێك بنیٚ.
من هیوایەکی
هەڵقولاّوی گۆچان بە دەستم ،
بە دوای سێبەری بوونما ،
پەرت و بلاّوم.
نامەویٚ
هەتاوی مردن ،
مافی ژیانم بسووتێنیٚ!
من رووبارێکی
بیٚ یاسا و
نۆرمی هیلاکی تینووم.
بە دوای مەرکانەی ،
فرمێسکا وێڵم.
نەوەکو دەریای پێکەنین
ئەبەدییەتی پیٚ ببەخشیٚ.
زۆر ناڕەوایە!
کاتیٚ سەیر کردنی بەهار ،
لە دایك بوونی گەلاّ
دڵۆپیٚ فرمێسك چی یە ،
بۆی نەڕێژریٚ.

کاتێ تەماشا کردنی پاییز ،
مردنی گەلاٚ
هیچ جوانیەکی
تیا بەدی نەکرێ.
من مرۆڤێکم ،
لەبەر ئەوەی لە دایك بووم ،
ئەبێ بژیم.
لەبەر ئەوەی لە دایك بووم ،
ئەشبێ بمرم.
من مرۆڤێکم ،
ئەمەوێ پەردە لە رووی
گروگاڵ وماڵئاوایی
هەڵماڵم.
ئەو هەگبەیەی
بە کۆڵمەوەیە ،
لەو بەینەدا
تەفسیرێکی گوومان لێنەکراوی
بۆ بدۆزمەوە.
بمەوێ یان نەمەوێ!
خەزانی من ،
بەهاری بوونەوەرێکی
تری بە دوا دێ.
زەردەخەنەی
رزگار بوونی من ،
سکالاٚی گریانی ساوایەکی
لە دوا دێ.
ئەمە ژیانەکەیە ،
ئەویشیان مردنە.
تان و پۆی یەکن ،
درێژی کەیتەوە
کورتی کەیتەوە
هەر شان بە شانی یەکن ،
تەواوکەری یەکن.
سوید / شوباتی 2004

PDF 4 KURD

# پێڕست